خۆشی کتێب لەوەدایە وتووێژە ، مشتومڕ نیە...

# بڵێسی گەنجان

## پڕۆژی تایبەت بە خزمەت کردنی کۆمەڵگا

نوسین و ئامادەکردنی: هەڵکەوت وریا عمر

## پێشەکی-

**سوپاسی بێپایان بۆ خودای مەزن ، لە دوای هەوڵ و ماندووبونێکی زۆر توانیم ئەم پەرتووکە بە کۆتا بگەێنم وە بیخەمەڕوو و پێشکەشی خوێنەرانی ئازیز و خۆشەویستی کەم ، وە دواکارم لە خودا ئەم نووسینەی کردوومە ببێت بە جێگایی ڕەزامەندی خوێنەران، وە ئەم کتێبە دیاریەکی بچووکە لەمنەوە بۆ خوێنەران وە بۆ هەموو ئەو بەرێزانەش هەموو دەم هاوکارم بوونە ، جا بە دەست خۆشی بێت یان بە نزایەک لە پەنهانیدا بێت، هیوادارم دیاریەکی بە پێز و چێژ و سودبەخش بێت بۆ هەموو ئەو کتێب دۆستانەی کاتی بە بەهایی خۆیان بۆ خوێندنەوە تەرخان دەکەن ، تەنها لەسەر ڕەفەی کتێبخانەکانیان داینانێن بۆ ئەوەی دیمەنێکی جوانی پێبەخشێت ، بەڵکو لە وتەکانی ناوی ڕادەمێنن وە لە هەر سات و جێگایەکدا بن. لە کۆتایدا سوپاس و پێزانینم بۆ بەرێز ﴿دینا لقمان﴾ کە وەک سەربازێکی ون خۆی تەرخانکرد بۆ نوسینەوەی وتەکان لە دانانی ئەم کتێبە ، دواکارم لە خودای گەورە ئەم کارەی بکاتە مایەی چاکە و خێرێکی نەبڕاوە وە ڕەحم و بەزەیی خۆی ببارێنێت بە سەریدا.**

**﴿١﴾**

**..فێربووم ئەوە داوابکەم کە دەمەوێت**

**...وە ڕازی بم بەوەی کە دەیەوێت**

**بەردەوام ویستی ئەو بەرە و چاکەی دەبردم ، وە ویستی خۆشم بەرە و خراپەی دەبردم ئەوەی گەڕاندمیەوە**

**زاتی (اللّٰه )یە...**

**کەداهێنەر و دروستکەرمانە ,**

**بەدیهێنەری هەمــووانە!**

*******************************

**﴿٢﴾**

**پەروەرێن بمبــووره!**

**زۆرجار ئەوە نەبوومـە,**

**کە تۆ ویستووتــە!**

**بەڵام تۆ هەموو جارێ,**

**ئەوەی کەمن دەمەوێت...**

﴿٣﴾

ئارام بەخشێک هەیـە ،

هەندێک کەس لێی تێنەگەیشتوون..

هەندێکیش پێی نەگەیشتـوون..

ئەوەش ئەزانی چییە؟

(نوێژە )

*********************************

﴿٤﴾

بوونـی متمـانە

لە نێوان دوو کەس دا

جوانترین ئەویـنە...

**(٥)**

**هەر کەسێکت بینی یەکسەر مەیخەرە**

**سەر سەرو سەر چاوت چونکە هەندێک**

**کەس فێرنەبوونە لە شوێنی بەرز...**

**گێژە بن !**

*******************************

**(٦)**

**ڕزگاربوون ، بەختەوەری و کامەرانی ،**

**میوەیەکە پێدەگات لە درەختــی ،**

**زانست و ئاگایــی!**

(٧)

حەق وەک ئاوێنەیەکی شکاو وایە!

هەر یەکە و پارچەیەکی هەڵگرتووە ،

دەڵێ حەق لای منە !

********************************

(٨)

لە ژیان بۆ دوو کەس ,

هەرگیز ڕونکردنەوە مەدە!

هاوڕێیەک کە باش ئەتناسێ ,

دوژمنێک کە چاوەڕێی کەوتنتە!

﴿٩﴾

دڵنیابە ئەو کارەی بۆ خودا بێت

دەگات و بەردەوام دەبێت ،

وە ئەو کارەشی بۆ خودا نەبێت

ناگات و لە ناو دەچێـت!

***************************

﴿خودا﴾ ﴿١٠﴾

تاقیت دەکاتەوە بە لە دەستانی کەسەکان

بۆئەوەی بزانیت ،

ئەوە تەنها خوادایە دەمێنێتـەوە!

﴿خودا﴾

تاقیت دەکاتەوە بە کەوتن...

بۆ ئەوەی بزانیت ،

ئەوە تەنها خودایە کە ڕاستت دەکاتەوە!

﴿خودا﴾

تاقیت دەکاتەوە بە فێڵی خۆشەویستانت..

بۆ ئەوەی بزانیت ،

ئەوە تەنها خودایە جێی ئارامی و دڵنیایە!

**﴿١١﴾**

**تاقیکردنەوە و ناخۆشیەکانی تۆ**

**بۆ تۆڵەکردنەوە نیە لە تــۆ....**

**بەڵکو بۆ پەروەردە و ڕاستکردنەوەی ،**

**ڕێگاکەی تۆیە !**

*******************************

**﴿١٢﴾**

**کورد دەڵــێ**

**هەوەس ئارەزوو بیــگری**

**مشتێکە...**

**بەری بدەی دەشتێکە!**

**(١٣)**

**ئەوەی ئەمڕۆ گرنگ بێت بۆت**

**مەرج نییە..**

**سبەی گرنگ بێت بۆت!**

*********************************

**(١٤)**

**لە باڵندەکانەوە فێر بە ,**

**هەر شوێنێک سارد بوو جێی بهێڵە!**

**((١٥))**

**گرنگی دانێکی لە پــڕ...**

**پێی دەڵێن بەرژەوەندی!**

*******************************

**((١٦))**

**ئەوەی لە خودا ترسی هەبوو**

**لە هیچ شتێک ناتــرسێ!**

**ئەوەی لە خودا ترسی نەبوو**

**لە هەموو شتێک ئەتــرسێ!**

﴿١٧﴾

**له ژیان دا خۆت بگۆڕە!**

**بەڵام هەرگیز خۆتت لێ نەگۆڕێت!!**

***************************

﴿١٨﴾

**له ژیان دا دەرگایان بە ڕووتدا داخست!**

**لە کونی کلیلەکەوە تەماشا مەکە,**

**یان دەرگاکە بشکێنە یان بڕۆ...**

(۱۹)

گەر گریان نەبوایە ,

ڕێزی پێکەنین نە دەما!

*********************************

(۲۰)

تەنیایـی بەنرخە ,

چونکە چۆڵە لە کەسانی بێ نرخ...!

**(٢١)**

**بیر لەوە مەکەوە چی بڵێیت ،**

**بیر لەوە بکەوە چی دەڵێیت...!**

********************************

**(٢٢)**

**وەک ئاگر بە لە ژیان!**

**ئەوەی دۆست بێت ،**

**شەیدای بڵێسەتە......**

﴿٢٣﴾

له ژیان نه ئەوەنە شیرین بە قوتت دەن ،

نە ئەوەنە تاڵ بە بـت تفێننەوە!

********************************

﴿٢٤﴾

یاساکانی ژیان دەبێ فێریان بین...

بەڵام دەبێ هەندێکیان بشکێنین!

﴿٢٥﴾

سەخترین ڕێگا پێی تێپەڕی ڕێگای حەقە..

لەو سەختر پێی تێپەڕی ڕێگای ئارامگرتنە!

****************************

﴿٢٦﴾

ئەمڕۆژگارەی ئێستا تێین ،

وشەی شیرینمان پێ دەوترێ

بەڵام تامێکی ترە بەخـشن...

**﴿٢٧﴾**

**مەرج نییە چەوتی سێبەرەکەت ،**

**ئاماژە بێت بە چەوتی ڕێگاکەت**

******************************

**﴿٢٨﴾**

**با پەیوەندیەکانت وەک گەڵای دار وابێت**

**ئەوەی دەمێنێتەوە لە گەڵت بەر دەگرێ ،**

**وە ئەوەی دەکەوێت ناگەڕێتەوە!**

**((٢٩))**

**مەرجی مەردبوون دووانە ئەوانیش**

**کەسێکە نە ئازاری دۆســتەدات**

**وە نە دڵی دوژمنیش شادەکات**

******************************

**((٣٠))**

**لەناو عاشقاندا جۆرێک لە شێتی هەیە ،**

**وە لەناو ژیرانیشدا جۆرێک لە شێتی هەیە**

**وە ئەمانە  جۆرێک لێکچوونیان هەیە!**

**(۳۱)**

**عیشق بینایی چاوەکان کەمەکات ،**

**کەچی خۆشەویستی بینایی چاوەکان**

**زیادەکات !**

******************************

**(۳۲)**

**گوێگرێکی لێزان بە !**

**چونکە کەسێک نیە هەموو شتێک بزانێت**

**بەڵام هەموو کەسێک شتێک دەزانێت...**

**((٣٣))**

**گەڕانەوەکان دواى ڕۆيشتن**

**يان بەزەييە يان پێويستييە...!!**

*******************************

**((٣٤))**

**هەڵەکان پەڕەيەکن ، بەڵام ژيان کتێبێکە**

**بۆيە هەرگيز کتێبێک لە دەست مەدە...**

**لە پێناو لاپەڕەيەک !**

﴿٣٥﴾

**کاتێک بێدەنگیەکەت نیشانەی نەفامییە!**

**لەناو مەملەکەتێک بیت ،**

**ڕازی بن بە ژێر دەستەیی....**

*******************************

﴿٣٦﴾

**بە ژیرانە هاوسەرگیری بکە!**

**تا بە ئاشقانە بژیت....**

**﴿٣٧﴾**

**ئەوانەی دەست بەردارت بوون ،**

**ئەوانە شایەنت نەبوونە....**

***************************

**﴿٣٨﴾**

**تێربوونی فکرت باشترە!**

**لە تێربوونی گەدەت.**

﴿٣٩﴾

**دین ئەوەیە کە پێت بڵێت:**

**چی بکەیت...**

**لە چی تێگەیت ...**

**وە چی بخوێنیت ...**

**وە ئەنجام و دەرئەنجامەکەت چیە بێت!!**

*******************************

﴿٤٠﴾

**خودا تەنها هی چاکەکاران نیە ،**

**بەڵکو هی تاوانبارانیشـە.**

**﴿٤١﴾**

**وەفاداری و ڕاستگۆی...**

**دەسەلمێنرێت بە زەمەن**

**نـەک بە زمـان!!**

***********************************

**﴿٤٢﴾**

**دین کاتێ بەکارهات بۆ بەرژەوەندی**

**پیرۆزی خۆی لە دەست ئەدات..**

﴿٤٣﴾

جوانی ڕووح گرنگترە لە جوانی ڕوخسار!

ئەگەر وا نەبوایە ڕووح نەدەچووە ئاسمان

لاشەش نەدەچووە ژێر گڵ.....

*******************************

﴿٤٤﴾

ئەوانەی هەوڵی شکانتیان دا...

لێیان خۆشبە ،

بەڵام هەرگیز ناویان لە بیر مەکە!!

﴾٤٥﴿

کاتێک تێدەگەی ئازار دەچێژیت

بەڵام کاتێک تێناگەی ئازاری

ئەوانەی دیکە ئەدەی...

*******************************

﴾٤٦﴿

مرۆڤە بچووکەکان!

گەورەترین چەکیان

﴾بوهتانە﴿ ...

(٤٧)

ئاوێنە هاوڕێیەکە!

کاتێ دەگریت

ئەو پێناکەنێت....

******************************

(٤٨)

دەڵێن خۆشەویستی کوێرتەکات ،

منیش دەڵێم وایە؟

چونکە بەر لەوەی ببیت

دایکت خۆشیویستووی...

**﴿٤٩﴾**

**بۆ زانینی نرخت لە نێو دڵەکان!**

**کلیلی تورەبوون بەکاربهێنە.**

***************************

**﴿٥٠﴾**

**باشبوونێکی زیاد لە پێویست!**

**گومان کردنە ،**

**لە نییەتت یان لە ئەقڵـت.**

﴾٥١﴿

**شۆڕش هەمیشە دوو ڕووی هەبووە ،**

**ڕوویەکی خوێن ، ڕوویەکی پەیام!!**

****************************

﴾٥٢﴿

**دەستێک بە زەلیلی بەرزکرێتەوە بۆ خوا**

**بە بەتاڵی ناگەڕێتەوە....**

﴿٥٣﴾

هەڵسوکەوت بکە لە گەڵ خەڵکی ...

بە ڕەوشتی خۆت نەک بە ڕەوشتی ئەوان!

******************************

﴿٥٤﴾

من کەسم نەبوو...

خودا هەموو کەسم بوو....

﴿٥٥﴾

له ژیان سێ تاکە پێڵاو ماچ کە ،

تاکێکیان کە لە پێـی باوکتە...

وە دووانیان کە لە پێی دایکتە!!

*******************************

﴿٥٦﴾

سەرێک لە مزگەوت چووە سجوود

ئەگەر دڵی نەجوڵا نیەتی سـوود!

**(٥٧)**

**ئەوەی هێناتە پێکەنین لە بیرتەکات ،**

**ئەوەی هێناتە گریان لە بیرت ناکات!**

*********************************

**(٥٨)**

**ئەوەی قسەی بۆ هێنایت**

**قسەشت ئەبات.....!**

((٥٩))

زەردەخەنە بکە

گەرچی...

دوای دۆڕانیش بێت!

********************************

((٦٠))

هەنێک بوونەتە دوو بەرە

بۆ عەیبی خەڵکی دادوەرە

بۆ عەیبی خۆی پارێزەرە.....

**﴿٦١﴾**

**کەم خۆری لاشە سووکە کات**

**کەم بڵێی سەر سەلامەتەکات!!**

*******************************

**﴿٦٢﴾**

**بۆ بەدەست هێنانی شتێک نەت بینیبێت**

**دەبێت کارێک بکەیت نەت کردبێـت!**

﴿٦٣﴾

ئەوەنە ڕابردوو لەگەڵ خۆت هەڵمەگرە

چونکە باری گەشتەکەت

بۆ داهاتوو قورسەکات...

*******************************

﴿٦٤﴾

گرنگە کاتژمێرەکەم لام ،

چونکە زۆر ڕووی نیشان دام!

**((٦٥))**

**مەلەکردن بە پێچەوانەی ڕووبار**

**هێز و لێهاتووی پێویستـە**

**ئەگەر نا ماسییە مردووەکانیش**

**ڕێڕەوی ڕووبارەکە ئەزانــن.**

**********************************

**((٦٦))**

**خراپترین ئەکتەر ڕاستگۆیانن...**

**باشترین ئەکتەر درۆزنانــن!!**

﴿٦٧﴾

هەمووان چاوی جوانیان دەوێت

نەک بینینێکی جوانیان بوێـت!

*******************************

﴿٦٨﴾

عاشقبوون بەرەو ڕووت هات

لە ناوچونت نزیک بۆتـەوە.

﴿٦٩﴾

هاورێیەکت تاقیکردەوە نەگونجا بۆت

ئاگەداربە نەیکەیتە دوژمنـت!!

********************************

﴿٧٠﴾

هەمووان بۆیە بە گەورەی

لە ئاسمان ئەڕوانین....

چونکە هێشتا بە دەستمان نەهێناوە...

﴿٧١﴾

متمانە دان دەبێت وەک ژیان بێت

نابێت دووجار بـبەخشرێت....!

*******************************

﴿٧٢﴾

خۆشەویستی ئادەمیزاد ئازاری هەیە...

بەڵام خۆشەویستی خودا ئاسوودەی هەیە

﴿٧٣﴾

دونیا بۆ پیاوان زەردەخەنەیەکە...

بۆ ژنان زەردەخەنەیەک دونیایەکە!!

********************************

﴿٧٤﴾

جوانی پێویستە بۆ ئەمانە ،

بیستن ، سەیرکردن ، بیرکردنەوە

بەڵام پێی هەڵمەخەڵەتـێ...!!

((٧٥))

چاکە لەگەڵ هەمووانا ناتوانیت بکەیت

بەڵام هەمووان.....

دەتوانیت فێرە چاکەبکەیت!!

*******************************

((٧٦))

هەڵەکردن پەڵەیە ، لای ئێمە....

بەکچەوە دیارە !

بە کوڕەوە دیارنیە !

**﴿٧٧﴾**

**مرۆڤ زۆر بەرژەوەند چییە؟**

**چونکە ئەگەر نوێژ موچە بوایە ،**

**کەس وازی لێ نەدەهێـنا !!!**

************************************

**﴿٧٨﴾**

**زۆربەی رقبوونەوەیان لێت**

**لەبەر ئەوەی لە پێشیانەوەیت.**

﴿٧٩﴾

خۆش بە حاڵت گەر نەفس کویلەتە

بەد بە حالت گەر نەفس سەرکردەتە!!

*******************************

﴿٨٠﴾

سەگ کەزانی خۆشت دەویَ

بەوەفا دەبیَ....

مرۆڤ کەزانی خۆشت دەویَ

هار دەبـیَ.....

**﴾٨١﴿**

**وریابە کێ دەخەیتە ناو دڵت!**

**لەوەیە ڕۆژێک بێت ،**

**دنیا ببەخشیت بەس دەری کەیت.**

*******************************

**﴾٨٢﴿**

**لە لوتکەی بەهێزی بیت**

**بوونی خیانەت لە پێتە خات!!**

(٨٣)

ڕاستی ڕووناکییەکی هەستپێکراو

وە بینـراوە...

بەڵام بۆ هەنێ کوێر هەستپێکراو

نەبینـراوە....

*********************************

(٨٤)

ئەوەی ئێمەی مرۆڤ ناتوانین دایپۆشین

بوونی تەمەنە هەر خۆی دەرەخـات.

﴿٨٥﴾

کەسانێک وەک هەوری ڕەشن بەسەرتەوە

تا نەڕۆن ڕووناکی ڕۆژت بۆ دەرناکەوێت!

*******************************

﴿٨٦﴾

جووینی بزمار باشترە

لە گفتووگۆ لەگەل نەفام!!

﴿٨٧﴾

ڕووخسارت پێناسەت ناکات

بەڵام ڕەفتارت دەیـکات!!

*******************************

﴿٨٨﴾

چاکە بە بێدەنگی کرا

کردەوە خۆی دێتە جواب!

﴿٨٩﴾

چۆنیەتی گریانت بە کەس مەڵێ

چونکە فێرکارییە بۆیـان!!

*******************************

﴿٩٠﴾

هەمووومان لە بوونی دڵدا هاوبەشین

بەڵام لە بوونی ویژداندا نـا !!

﴿٩١﴾

بۆ بچووکبوونەوەی شتەکان لە چاوتا

بوونی گەورەی خوات پێویستە لە دڵتا...

*******************************

﴿٩٢﴾

دووڕووی بەرهەم هێنەری درۆیە!!

داواکـاری دوژمنانە

هەڵخەڵەتێنەری نەزانانە

پەیڕەوکەری خەڵکانە......

﴿٩٣﴾

له ماڵه بێگانه بووی کوێر به ،

که هاتیته دەر لاڵ بە!!

*******************************

﴿٩٤﴾

دووباره بوونەوە لاى عەقڵ نالەباره

بەڵام لاى نەفس له بار !

(٩٥)

دڵشکانی بەبێ هـۆ.......

مردنی هەستەکانی لێ دەکەوێتەوە!

*******************************

(٩٦)

گرنگترین کار بۆ هاتنی خێر و بەرەکەت

گرنگی دانە بە دایـک و نوێژەکـەت.

**﴾٩٧﴿**

**بۆ ڕۆیشتنی پەشیمانی لە باخەکەت ،**

**پێویستت بە چاندنی درەختی ئارامییە.**

******************************

**﴾٩٨﴿**

**لەگەڵ بـوونی ئامانج...**

**دوو دەست بۆت درێژ دەکرێت**

**دەستێکیان ئەتگەێنێتە ئامانج**

**دەستێکیان دورتە خاتەوە لە ئامانج**

**بزانە کامـە دەسەگریـت!!**

**﴿٩٩﴾**

**قسەی دڵ لە دڵە کەوێ....**

**قسەی زاریش بەر بای گوێ کەوێ!!**

******************************

**﴿١٠٠﴾**

**جیاواز بوون لە ژیان**

**بوێری دەوێـت...**

**بۆیە بوێربە و مەترسە!!**

﴿١٠١﴾

ئەی هاوڕێ ئەگەر ڕۆژێ بێتاقەتم کردی

لێم زیز مەبە ؟

لە بیرت بێ چەندین ڕۆژ دڵخۆشم کردوی!

*****************************

﴿١٠٢﴾

ناخۆشترین ساتی تەمەن درێژی ئەوەیە

مردنی ئازیزانت بەچاو خۆتە بینـیت!!

**﴿١٠٣﴾**

**له هاوكارى خه‌ڵكى وه‌ك ڕووبار به‌ ،**

**له‌ شاردنه‌وه‌ى كه‌م و كوڕى وه‌ك شه‌و به‌!**

******************************

**﴿١٠٤﴾**

**ئافره‌تى باش ته‌نها يه‌ك شتى ده‌وێت**

**گه‌يشتن به‌ دڵێكى ميهره‌بان!!**

**﴿١٠٥﴾**

**دەتەوێ کەسی بەرامبەر پێناسەت بکات**

**تەنها تورەی بـکە!!**

****************************

**﴿١٠٦﴾**

**دەبێ جیلێک دروست بێت....**

**چاکەکردن دروشمی بێت نەک گۆڕین!!**

﴿١٠٧﴾

تامی شکست بە سەربەرزی

خۆشترە لە سەرکەوتنی بە فێڵ!

*******************************

﴿١٠٨﴾

هەر کاتێ دڵ ئاگەدار بووە بۆ تەوبە

بزانە خودا خۆشی ئەوێت !!

**﴾١٠٩﴿**

**میزانی خودا و مرۆڤ زۆر جیاوازن**

**لای مرۆڤ**

**یەک هەڵە هەزار چاکە ئەسڕێتەوە**

**بەڵام لای خودا**

**یەک چاکە هەزار هەڵە دەسڕێتەوە!!**

***************************

**﴾١١٠﴿**

**ڕوونکردنەوەی زۆر پێویست ناکات**

**بۆ کەسانێک کە کوێرن!!**

﴾١١١﴿

خەندە دوو سودی هەیە بۆت...

دۆستانت دڵشاد دەکـات

دوژمنانیش دڵتەنگە کـات!

**************************

﴾١١٢﴿

گرنگ نیە کێ لە سەرەتاکان لە گەڵتە

گرنگ ئەوەیە کێ تا کۆتاییەکان لە گەڵتە!!

**(١١٣)**

**تەنها سوجدەیە خەمە بات ،**

**وە تەنها دووعایە خۆشی دێنێت!!**

******************************

**(١١٤)**

**مەرج نییە هەمووان دڵخۆش کەیت**

**مەرج ئەوەیە ئازاریان نە دەیـت!!**

((١١٥))

قسه به بەری کەس مەدورە....

بەڵام ئەوەی لە بەری کرد پیرۆزی بێت!

************************

((١١٦))

خۆت برینی خۆت سارێژ بکە

چونکە ئەوانی تر تەنها ئەزانن

بیکولێننەوە و قوڵتری ئەکەن!!

**﴿١١٧﴾**

**گەنجی گەوهەر....**

**بزانە لە چی تەرخانی ئەکەیت**

**پێش ئەوەی پیر دابێیـت!!**

*****************************

**﴿١١٨﴾**

**پێش قسەکردن بیربکەوە**

**بەڵام بیرت کردەوە قسەناکەیت!!**

**﴿١١٩﴾**

**بەداخەوە زۆربەی هێرشەکان کراوەتە سەرمان لەلایەن ئەوانەوە بووە کە زۆر**

**چاک بووینە لە گەڵییان !!**

***********************************

**﴿١٢٠﴾**

**ئەگەر باش بوویی..**

**کەس نەیبیـنێ**

**خودا دەیبیـنێ !!**

﴿١٢١﴾

وامان لێ هاتووه ئەوانە دەڵێین

کە مەبەستمان نییە ، بەڵام ئەوانە

ناڵێیین کە مەبەستمـانە!!

*****************************

﴿١٢٢﴾

مرۆڤ وای لێ هاتووه لەم زەمانە

بڕوای بەوە نیە کە دەیـکات...

بەڵام بڕوای بەوە هەیە نایکات!

﴾١٢٣﴿

کردنی پرسیاری جوان

وەڵامدانەوەشی جوانە.

*****************************

﴾١٢٤﴿

هەوڵدە شارەزا و دانابە

بەڵام هەرگیز بەیانی مەکە!

﴿١٢٥﴾

جاروایە زەردەخەنەیەکی چەن ساتی

کاریگەری چەند ساڵـی هەیە!!

***************************

﴿١٢٦﴾

فرمێسک مەرێژە بۆ هیچ پەیوەندیەک

لە ژیان دا ، چونکە هەندێ پەیوەندی

شایەنی فرمێسک نیین!!

﴿١٢٧﴾

دڵت هەگبەیەک بێت

لەشتی هیچ پڕی مەکە!!

******************************

﴿١٢٨﴾

چاکەکانت کەس نەیبینێ

دڵنیابە خودا دەیبینێ!!

﴿١٢٩﴾

ساردبوونەوە و ئیهمال کردنمان ،

لە ئەنجامی گرنگی پێدانێکی......

زۆربوو بۆیان.

******************************

﴿١٣٠﴾

ژیان کردن لە دورەوە خۆشترە

لەوەی کەسانی درۆزن نزیک بیت!

﴿١٣١﴾

**ڕۆژەکان وای لێ هاتووە...**

**هەم تەنیایی بێزاریـیە**

**هەم تێکەڵبوونی مرۆڤەکان!!**

******************************

﴿١٣٢﴾

**بەشێک لە خەڵکی لە ژیاندا**

**لەکاتی دیمەنی کەوتـن**

**لەباتی دەست گرتـن**

**وێنەت دەگرێـت!**

﴿١٣٣﴾

زۆربەی بەڵێنەکان

درۆیەکی شیرینن!

******************************

﴿١٣٤﴾

دروستکراوی بۆ ڕازیکردنی خالق

نەک بە دڵی ئەم و ئەو!!

﴿١٣٥﴾

گەر تورەیان کردی

نهێنییەکان ڕیکلام مەکە!

******************************

﴿١٣٦﴾

عینادی لە کاتی هەڵەکردن ناشرینتەکات

بەڵام داوای لێبوردن جوانتەکات.

﴾١٣٧﴿

دروستبوونی زۆربەی خۆشەویستیەکان

بە مەرجـە

تەنها خۆشەویستی دایک نەبێت

بێ مەرجـە!!

*******************************

﴾١٣٨﴿

گەر خەڵکان بشکێنیت

لە حورمەتی خۆتا نامێنیت!!

﴿١٣٩﴾

بیستەکانی تەمەن ناخۆشترین قۆناغی ژیانە ، لەوە

بچووکتری بەرگەی هەموو

شتێک بگری ، لەوەش گەورەتری

لای دایکت بگری!!

******************************

﴿١٤٠﴾

ئەگەر لە دڵاندا شتێکت چاند

گەر خۆشەویستی نەبوو با ڕێزبێت!!

﴾١٤١﴿

چەند زیرەک و کارامە بیت

لەوەیە دڵ بەرە و گەمژەی بتبات!!

******************************

﴾١٤٢﴿

ئەوەی لە دڵ دایە

چەندیش دڵ بشکێنێ

هەر لە لووتــکە دایە!!

﴿١٤٣﴾

درێژترین ڕێگایی ژیان ڕێگای خودایە

کۆتایی ئەو ڕێگایە گرنگ نیە...

مردن لەسەر ئەو ڕێگایە گرنگە!!

*******************************

﴿١٤٤﴾

ویژدان...

لە هەمـوو دڵێک ناڕوێ!

﴿١٤٥﴾

**پاشەکشێ لە حەقدا مەکە**

**گەر تەنیاش مایتەوە!**

******************************

﴿١٤٦﴾

**بانزاو پاڕانەوەکانمان لە خودا**

**تەنها بۆ ماڵ و سامان نەبێت**

**با تەنها بۆ ئازادی بێـت!!**

﴿١٤٧﴾

هەنگاوە بچووکەکانت لە ژیان

باشترە لە وەستانت لە ژیان!

*******************************

﴿١٤٨﴾

جوانی باشە بۆت

بەڵام باشبوونت جوانترە بۆت!!

﴿١٤٩﴾

جوانترین لێک تێگەیشتن

یەکتر قبووڵ کردنە!!

******************************

﴿١٥٠﴾

بۆ گەیشتن بە خەونێک

سەرەتا خەیاڵی پێویستە!

﴿١٥١﴾

**له ژیان مەرد بە!**

**یان هاوڕێیەکی بەوەفابە**

**یان نەیارێکی ئاشکرابە.**

******************************

﴿١٥٢﴾

**باشترین مامۆستای ژیان**

**خودی ئازارەکانی خۆمانە!!**

﴿١٥٣﴾

بەسە كۆیلەبـوون

سەلامەتی مەبە پێش

ئازادی!

*******************************

﴿١٥٤﴾

کاتێ شەڕی بێتاقەتیم پێت فرۆشت

بزانە خۆشەویستی لام!!

﴿١٥٥﴾

جوانی خەیاڵ لە بێ دەنگییە..

چونکە دەگەیتە خۆزگەیەکی مەحاڵ!

*******************************

﴿١٥٦﴾

لەکاتی بە جێهێشتنندا

جوانترین شوێنەوار

شوێنەواری خۆشەویستیە

نەک رق!!

﴿١٥٧﴾

پێش کەشتی بنیات نان

برِوانە لە دەریا!!

*******************************

﴿١٥٨﴾

غیرەکردن جوانی خۆی هەیە

بۆیە کەسێک غیرەی لێ کردی

پێویستە بۆی بمری!

﴿١٥٩﴾

گەر ئاشقی کەسێک بوویت

ڕابردووی ڕووناک مەکەوە

بەڵکو داهاتووی ڕۆشن بکەوە!

******************************

﴿١٦٠﴾

مرۆڤەکان بە دوو شێوە

بەختەوەرت ئەکەن

هەندێکیان بە هاتـن

هەندێکییان بە ڕۆیشتن!!

**﴿١٦١﴾**

**هاورِێی باش ئەوەیە وەک ئاوێنە بێت**

**بێ گفتوگۆ لە چاوت بگـات**

**وە بێ بەرامبەریش خۆشی بوێیت!!**

******************************

**﴿١٦٢﴾**

**لەگەڵ منالان بە شێوەیەک یاری بکە**

**کە هەستی بردنەوەیان بۆ دروست کەی!**

﴿١٦٣﴾

جوانترین پرد لە نێوان مرۆڤەکان

دۆستایەتیە

هەرگیز هەوڵی ڕووخانی مەدە!!

******************************

﴿١٦٤﴾

کە گوێم بۆ وتەکانت گرت

بزانە گرنگی لام !

**﴿١٦٥﴾**

**هاوڕێی ئەم سەردەمە دوو جۆرە؟**

**هەیە وەک هەنگە ڕێی گوڵە زانیۆ!**

**هەشە وەک مێشە ڕێی زبڵە زانــیۆ!**

*******************************

**﴿١٦٦﴾**

**ڕق ژەهرێکە چووە دڵەوە**

**بە مەرگی دڵ کۆتایی دێت!**

﴿١٦٧﴾

خۆشترین شت بوونی هەبێ

بوونی نیشتمانێکی ئازادە!

*******************************

﴿١٦٨﴾

لەسەر چاوەڕوانی پرسیار مەکە

تەنها سەیری ڕوخسار بکە !!

﴿١٦٩﴾

لەم دنیا بێ من مەبە...

لە قیامەتیشدا بێ من مەڕۆ!

*******************************

﴿١٧٠﴾

تاوانێکی گەورەیە...؟

ڕووت لە قیبلە بێت و

پشتت لە خودا بێت!!

﴿١٧١﴾

وەک هەنێ باڵندە فڕین نازانیت!

مەڵێ مانەوە لە قەفەس چارەنووسە!

******************************

﴿١٧٢﴾

هەمووان بەلای زۆرێکا تێپەڕبووین

بەڵام لەگەڵ کەمییان تێکەڵ بووین!

﴿١٧٣﴾

هەرچی دەکەی بیکە

بەڵام دڵی خەڵکی مەڕەنجێنە

وە سنووری خواش مەبەزێنە!

******************************

﴿١٧٤﴾

نەبوونی جوانی بە ئەخلاق پڕدەکرێتەوە

بەڵام نەبوونی ئەخلاق بە هیچ جوانیەک

پڕنابێتەوە!!

**﴿١٧٥﴾**

**هەرگیز بەهاکانی خۆت**

**بە تەرازووی خەڵک مەکێشە!**

*******************************

**﴿١٧٦﴾**

**نیشتمانێکی ئازاد ناتوانم پێی بگەم**

**لە تواناشم دا نیە لێی جیاببمەوە!!**

**﴿١٧٧﴾**

**ناشیرینترین مرۆڤ ئەوەیە**

**زمانی شتێک بڵێ!**

**وە کردەوەی شتێک تر بێ!**

*******************************

**﴿١٧٨﴾**

**لەکاتی سەرکەوتن هاوڕێکانت ئەتناسن**

**تۆکێـی...**

**بەڵام لە کاتی کەوتن تۆ ئەیان ناسی!**

**﴿١٧٩﴾**

**هێزی ویست و ئارەزوو**

**لە حەق بەکارنەهات**

**لەنەزانی و نەفامی بەکاردێت!**

*******************************

**﴿١٨٠﴾**

**پابەندبوون بە حەق دژوارە**

**خۆڕاگربوون لەسەری دژوارترە!!**

﴿١٨١﴾

**له نووسیندا زانابه**

**بەڵام له وتوێژدا**

**ئاسایی به!!**

*******************************

﴿١٨٢﴾

**ژیان ڕێڕەوێکه**

**ئێمەش تەنها ڕێبوارێکی ئەو ڕێگایەین!**

﴿١٨٣﴾

خودا بەو شێوەیە مەپرستە

که خۆت دەتەوێت

بەڵکو بەو شێوەیە بیپەرستە

که ئەو دەیەوێت!!

******************************

﴿١٨٤﴾

خۆ گەمژەکردن جار وایە

پێویستە

بۆ هەڵسەنگاندنی ناسیاوانت!

﴿١٨٥﴾

خۆت دەرمەخە وەک بەرپرسێک

خۆت دەرخە وەک بەر پرسیارێک!

*******************************

﴿١٨٦﴾

سەلماندنی خۆشەویستی

بە کردەوەیە ، نەک بەوتـە!!

﴿١٨٧﴾

کێشەی ئێمە ئەوەیە

حەزمان لە ژیانێکی ئەوروپیە!

وە مردنێکی ئەصحابەییە!

******************************

﴿١٨٨﴾

کاتێ بە سادەیمت زانی

مانای ئەوە نیە بڵێم

وەرە سەر پشتم!

《١٨٩》

**مرۆڤە باش و ڕاستگۆکان**

**هیچ کاتێک نادۆڕێن**

**بەڵکو لە دەست ئەچـن!**

*******************************

《١٩٠》

**ڕۆژێک دێت....**

**بە ئارامگرتن دەوترێ بێ چاو وڕووی**

**بە قوربانی دانیش ئەوترێ لاوازی!!**

﴿١٩١﴾

**پەشیمان بوونەوە و وازهێنان لە ژیان**

**هەندێ پەیوەندی فێرمانەکات!!**

*******************************

﴿١٩٢﴾

**جوانترین هێز هەت بێت**

**ئارامگرتنە!**

**(١٩٣)**

**هەنێ مرۆڤ هەیە**

**ناتوانین پێی بگەین**

**ناشتوانین لێی جیاببینەوە!**

************************************

**(١٩٤)**

**هەمووان گوێیان لە دەنگمانە**

**بەڵام کەمییان ئاگای لە دڵمانە!**

**(١٩٥)**

**دڵێک خۆشەویستی نیشتمانی تیانەبێ**

**دەری بهێنیت بۆت باشترە!!**

*****************************

**(١٩٦)**

**لە ڕوودا ناخ بڕازێنەوە**

**چونکە مرۆڤ ڕووە بینێت**

**خوداش ناخە بینێت!!**

﴿١٩٧﴾

گەر جوامێری زیان بەکەس مەگەیەنە

گەر گەیاندیشت بە دۆست مەیگەیەنە!

******************************

﴿١٩٨﴾

پەرێشانی نیوەی تەمەن ئەبات

پەشیمانیش نیوەکەی تـری.

**﴿١٩٩﴾**

**لەژیان**

**مەهێڵە غەم لە باوشت بگرێ**

**یان وەسوەسەکانی ئەم جیهانە بتگرێ!!**

*******************************

**﴿٢٠٠﴾**

**چاکەت خۆشبوێت گەر ئەنجامیشت نەدا**

**ڕقت لە خراپە بێت گەر ئەنجامیشت دا**

**﴿٢٠١﴾**

**ناخۆشترین عەزاب ئەوەیە ؟**

**کەسانێک لە چارەنووسمان نین**

**بەڵام لە ناخماندا ئەژیــن!!**

********************************

**﴿٢٠٢﴾**

**ناسینی هەندێک بۆمان دۆستە**

**وە هەندێکی تر دەرسە!!**

﴿٢٠٣﴾

**ئەوانەی کە بۆمان دێت**

**باشترە لەوەی لە دەسمان چووە!!**

*******************************

﴿٢٠٤﴾

**دواکردن لە خودا لە تەنگانەدا شانازییە**

**لەبیرکردنی لە خۆشیشدا شەرمەزارییە!**

**﴿٢٠٥﴾**

**جیاوازی نێوان ڕەوشت و پارە ئەوەیە؟**

**ڕەوشت موڵکی خۆتە...**

**بەڵام پارە موڵکی هەموو کەسێکە!!**

*******************************

**﴿٢٠٦﴾**

**زیادبوونی ڕاستگۆی**

**بێ ئاگات دەکات لە درۆیی ئەوانی تر!**

**﴿٢٠٧﴾**

**کاتێک یەکێ دەمرێ**

**خەڵکی دەڵێن چی بەجێهێشت**

**مەلایکەتەکەنیش دەڵێن چی هێنا!!**

*******************************

**﴿٢٠٨﴾**

**بەس خودا مەدۆڕێنە**

**لە هەموو شتێک براوەیت!!**

**﴾٢٠٩﴿**

**تاکە خوێنەری دڵەکان**

**تەنها خودایە و بەس!!**

*******************************

**﴾٢١٠﴿**

**کاتێک ڕۆژگار لە گەڵت نەگونجا**

**دەبێ تۆ لە گەڵی بگونجێیت!**

**﴿٢١١﴾**

**ئارامگرتن دوو شتت فێرەکات**

**یان بە ئاوات دەگەیت**

**یان لە حیکمەت دەگەیت.**

******************************

**﴿٢١٢﴾**

**تاکە شت جار وایە ژیانت تێکەدات**

**دڵ سافی و سادەییە!!**

﴿٢١٣﴾

هەندێک مرۆڤ

لەبەر خۆشییەکانی بەهەشت

خودایی بیر نەماوە؟

*******************************

﴿٢١٤﴾

هیچ ناسینێک بە ڕێکەوت نیە

بەڵکو بەهۆی هۆکارە باشەکانەوەیە.

﴾٢١٥﴿

هەندێک لە سەرەتاکان جوانە

بەڵام تۆ هەمووکات جوان بە!!

*******************************

﴾٢١٦﴿

باشترین سیفەتی درۆزنان

بوونی بیر تیژیانە!!

**(٢١٧)**

**دڵی دایک**

**تاکە قوتابخانەی هەمووانە!!**

***********************************

**(٢١٨)**

**کۆیلەی دەست بە چەتر**

**ڕقی لە بارانی ئازادییە!!**

**(٢١٩)**

**هەل دەرگایەکی کراوە نییە**

**بەڵکو هەنگاوەکانی خۆتە!!**

*******************************

**(٢٢٠)**

**ژیانی ئەمڕۆ وەک دەریایە**

**کەشتی ئامانج نەبێ ئەخنکێیت!!**

**﴿٢٢١﴾**

**کات وەک چەقۆیە**

**دەسکەکەی نەگری**

**دەستە بڕێ!!**

*******************************

**﴿٢٢٢﴾**

**کات بەکارنەهێنی بۆ داهاتوو**

**مەشغوڵتەکات بە ڕابردوو!!**

**﴿٢٢٣﴾**

**ئاگەداربە ئاڕاستەی ڕۆیشتنی تۆ**

**دوێنێ نیە ، بەڵکو بەیانییە!!**

*******************************

**﴿٢٢٤﴾**

**باشترین کاری مروڤ**

**بەجێهێشتنی ئاسەوارێکی جوانە**

**﴿لە دڵدا﴾**

**﴿٢٢٥﴾**

**ڕێکەوتەکان ژیانت باشتر ناکەن**

**بەڵکو گۆڕینەکانت ژیانت باشترەکەن!!**

***********************************

**﴿٢٢٦﴾**

**﴿ئەی کوردستان﴾**

**سەربازێکی گیان فیدام بۆ تۆ**

**لە ڕیزی پێشەوەم بۆ پاراستنی تۆ.**

**(٢٢٧)**

**دەربكەوی سەرناكەوی**

**سەربكەوی دەرەكەوی!!**

******************************

**(٢٢٨)**

**گەورەترین توانام لە بێ توانایيەوە بوو**

**وە گەورەترین هیواكانیشم**

**لە بێ هیوای بوو!!**

**﴿٢٢٩﴾**

**ابن القيم دەڵی....**

**چوومە سەردانی هاوڕێیەکم**

**توشی لە بیرچوونەوە بوو بوو**

**وتم دەمناسییەوە....؟**

**وتی نەخێر...**

**بەڵام زۆرم خۆشدەوێیت نازانم بۆ.....؟**

**دەڵێت ئەو کاتە تێگەیشتم ئەوە مێشکە**

**شتی بیرە چێ نەوەک دڵ!!!**

*******************************

**﴿٢٣٠﴾**

**هەمووان حەز بە ئاشتی دەکەین**

**بەڵام کەمان کاری بۆ دەکەین.**

**﴿٢٣١﴾**

**تاکە ڕێگا بۆ ژیانێکی نەمر**

**مردنە لە پێناو گەلەکەتا.**

**********************************

**﴿٢٣٢﴾**

**دروسبوونەکان پڕن لە نهێنی**

**بە تایبەت دروستبوونی مرۆڤ!!**

﴿٢٣٣﴾

وەک پەیژە مەبە ئەی مرۆ

پێتاسەرکەون و پێتا بێنە خوارەوە!

******************************

﴿٢٣٤﴾

ئاسانە بە نارەحەتییەکانی خەڵک پێکەنیت

ئازایەتی لەوەیە

بە نارەحەتیەکانی خۆت پێکەنیت!!

﴿٢٣٥﴾

ژیان وەک پیاز وایە

حەزمان پێیەتی بەڵام

جارو بار دەمانگیرێنێ!!

******************************

﴿٢٣٦﴾

تاکە کۆمەڵە پێویستیان بە ڕابەر نیە

ژیر و هۆشیارانن!!

﴿٢٣٧﴾

کاتێک وایستت واز لە ژیان بێنیت

واز لە ئازادی بێنە و بەس!!

*******************************

﴿٢٣٨﴾

کاتێک کە گەنجین

هەوڵی گۆڕینی خۆمان ئەدەین

بەڵام کاتێک پیرەبین

هەوڵی گۆڕینی گەنجان ئەدەین!!

﴿٢٣٩﴾

له ئادەمیزاد مەپرسە چی دەزانی

بپرسە چی دەتوانی

ڕەنگە زۆر شت بزانێ!

******************************

﴿٢٤٠﴾

نەکەوتن لە ژیان شانازی ناوێ

هەستانەوە شانازی دەوێ!!

﴿٢٤١﴾

نیشتمانپەروەری چرایەکی بڵێسەدارە

!!هەمووان حەزیان بە پرشنگدانی نییە

******************************

﴿٢٤٢﴾

قسەی چاک و بیری چاک

بۆ ئەوەی بە کەڵک بێن

پێویستیان بە فەرمانی چاکە.

﴿٢٤٣﴾

گرانترین کار مرۆڤ بیکات

کارکردنە لە سەر خۆناسین!!

*****************************

﴿٢٤٤﴾

سپڵەی مرۆڤ بەرامبەر خودا

لەوە دەرەکەوێ ، هەمیشە

بەڵاکان دەژمێرێت.....

و نیعمەتەکانیش لەبیرەکات!!

**﴿٢٤٥﴾**

**زۆربەی ڕق لێبوونەوەکان**

**لەبەر ئەوە نییە کە ڕاستین**

**لەبەر ئەوەیە کە جیاوازین!**

******************************

**﴿٢٤٦﴾**

**هەندێک جار ڕاستگۆیی ئازارتەدات**

**بەڵام شەرمەزارت ناکات.**

**﴿٢٤٧﴾**

**چاكە تێپەڕ بوو شوێنی كەوە**

**بەرەو ڕووت هات پێشی كەوە!!**

*************************************

**﴿٢٤٨﴾**

**گەل كاتێک دەژی كەناو گەورەكانی**

**لەپاش مردن بژێنێت!**

﴿٢٤٩﴾

جوانترین خۆشەویستی

خۆشەویستی نیشتیمانە!

*******************************

﴿٢٥٠﴾

تاکە دەرمانی کەسانی گەوج

لە خۆبایی بوونێتی!

**﴿٢٥١﴾**

**بوونت دۆست پەیاکات**

**نەبوونت تاقیان دەکاتەوە!!**

*******************************

**﴿٢٥٢﴾**

**لە هەر پلەیەک بوویت**

**نیشتیمان پەروەر بە!**

﴿٢٥٣﴾

برین لە پڕێکدا ڕوو دەدات

سارێژبوونەوەی لە چەند مانگێک

بۆیە ئاگەدار بە!!

******************************

﴿٢٥٤﴾

جوانترین ئیش

بیرکردنەوەیە لە یەزدان.

**﴿٢٥٥﴾**

**باشترین ناسنامە بۆ مرۆڤ**

**هەبوونی گەل و وڵاتە!!**

*******************************

**﴿٢٥٦﴾**

**تاکە چەک بە دەست بێ**

**تەنها پێنووسە!!**

**﴿٢٥٧﴾**

**ئاقڵ ئەوەیە لەگەڵ ڕۆژگار بگونجێ**

**نەک ڕۆژگار لەگەڵ خۆی بگونجێنێ!**

*******************************

**﴿٢٥٨﴾**

**گەر ویستت هەڵەکانت خەڵکی بیبینێت**

**دەست بکە بە تەمێ کردنیان!**

**﴿٢٥٩﴾**

**زۆر خەریک مەبە بە پاکی بەرگت**

**بەڵکو زۆر خەریک بە پاکی دەرونت!**

******************************

**﴿٢٦٠﴾**

**هەموو نەتوانینەکان**

**بە هەوڵدان دەکرێت!**

**هەموو نەزانینەکانیش**

**بە فێربوون دەڕوات!**

**هەموو ئەستەمەکانیش**

**بە تاقیکردنەوە دەڕوات!**

﴿٢٦١﴾

گەورەترین لوتکەی نەزانی

شانازی کردنە بە زانینەوە!

******************************

﴿٢٦٢﴾

لە کاتی بەختیاریدا هەمیشە باشین

بەڵام لە کاتی باشبووندا هەمیشە

بەختیار نیین.

**﴿٢٦٣﴾**

**گەر دۆست گر نیت**

**دوژمن پەیداکەر مەبە!**

*******************************

**﴿٢٦٤﴾**

**ئافرەت شەمەندەفەری هەست و سۆزە**

**وێستگەی وەستانی تەنها دڵە!!**

﴿٢٦٥﴾

جوانترین تایبەتمەندی ئافرەت ئەوەیە؟

خەفەتی زۆر لە نەبوونی خۆی ناخوا....

بەڵکو خەفەت لە نەبوونی ئەوانی ترەخوا.

******************************

﴿٢٦٦﴾

کاتێک دەرگاکانی دنیات بەسەر دادەخرێت

گەر مردن هات!!

﴿٢٦٧﴾

**پاشترین پەناگە بۆمان**

**پەناگەی خودایە!**

******************************

﴿٢٦٨﴾

**باشترین بەرگ پۆشین**

**بۆشارنەوەی خەمەکان**

**بریتیە لە زەردەخەنەکردن!!**

﴿٢٦٩﴾

مرۆڤەکان دابەشبوونەتە دوو جۆرەوە؟

جۆرێکیان دروستت دەکەن

جۆرێکیان دەترۆخێـنن.

*****************************

﴿٢٧٠﴾

کە دڵنیابوویت(إِنَّ الْأَمْرَ كُلَّهُ لِلَّهِ)

واتە : بێگومان کاروبار هەمووی

بەدەست خودایە.